زنجیرە وتاری (شیرك و شیركی گوێڕایەڵی كردن)

# الشِّركُ وشِركُ الطَّاعَةِ

## الـديمقراطـية – مـبدأ المســـاواة

## دیموكـــراسی - بنەمـــای یەكسـانی

وتاری شازدە


شێخی موجاهید

أبو علي الأنباري تقبله الله



وەرگێڕان و ئامادەكردنی

پێگەی ڕاستەڕێ






پێگەی ڕاستەڕێ

بسم الله الرحمن الرحيم

وتاری
شێخ ئەبی عەلی ئەنباری -تقبه الله-

وتاری (پازدە)

بەناونیشانی
ديموكراسی – بنەمای یەکسانی

وەرگێڕانی
پێگەی ڕاستەڕێ



الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله

خوایە حەقمان بە حەق پیشان بدە و یارمەتیمان بدە لەسەر شوێنکەوتنی، وە باتڵیشمان بە باتڵ پیشان بدە و یارمەتیمان بدە لەسەر ئەوەی لێی دووربکەوینەوە، خوایە ئەوەمان فێر بکە کە سوودمان پێدەگەیەنێت و سوودمەندمان بکە بەوەی فێرمان دەکەیت، پەروەردگارا لەوانەمان بکەیت کە کار بە زانستەکەیان دەکەن، خوایە زانستەکەمان بکە بە بەڵگە و حوججە بۆمان ئەو ڕۆژەی بە دیدارت دەگەین و نەیکەیتە بەڵگە بەسەرمانەوە ئەی چاکترینی بە بەزەییان، ئەی پەروەردگارم سینەم ئاسوودە و گوشاد بکە و کاروبار و هەوڵ وکۆششم بۆ ئاسان بکە و گرێی زمانم بکەرەوە و زمانم گۆیا و پاراو بکە تا لە گوفتارم تێبگەن، پەروەردگارا کردەوەکانم چاك بکە و تەنها بۆ ڕەزامەندی تۆ بێت و هیچ بەشێکی تێدا نەبێت بۆ هیچ یەکێك لە دروستکراوانت، لە پاشاندا:

لە فەزڵ و بەخششی الله تعالى تەواو بووین لە پێناسەکردنی دیموکراسی و پەیوەندی بە ئیسلام، پاشان باسی کۆڵەکەی یەکەمان کرد لە کۆڵەکەکانی دیموکراسی: ئازادی بیروباوەڕ، پاشان ئازادی ڕادەربڕین، پاشان ئازادی تاکەکەسی، ئەمڕۆش بە ئیزنی الله تعالى باسی لایەنێکی تر لە بابەتەکانی پەیوەست بە دیموکراسی دەکەین کە ئەویش بریتییە لە بابەتی یەکسانی، جا پشتیوان بە الله عز وجل دەڵێم:

ڕژێمە دیموکراسییەکان -لە هەر شوێنێك بێت- دامەزراوە لەسەر بناغەی یەکسانی لە نێوان تاکەکانی کۆمەڵگا بەبێ جیاوازی کردن لە نێوان نێر و مێ، وە بەبێ جیاوازی کردن بەهۆی دین یان مەزهەب، ئەم شتەش لە ماددەی چواردە هاتووە لە دەستوری عێراقی، ماددەکە بەم شێوەیەیە: "عێراقییەکان یەکسانن لەبەردەم قانون بەبێ جیاوازی کردن بەهۆی ڕەگەز یان دین یان مەزهەب یان بیروباوەڕ یان باری کۆمەڵایەتی" ئەم ماددەیە ژمارەکەی چواردەیە و دەقەکەشی ئەوە بوو کە باسم کرد، تێپەڕیم بەسەر هەندێك وشە لە ماددەکەدا و تەنها باسی ئەوانەم کرد کە کارمان پێیەتی.

لە باسکردنی یەکسانی دەوەستین لەسەر سێ وشە کە لەم دەستورەدا هاتووە، وە ئەمە کارپێکراوە لە هەموو وڵاتانی دیموکراسی، بەوەی هەموو خەڵك یەکسانن و هیچ جیاوازییەك نیە لە ڕووی ڕەگەز، واتە ئافرەت جیاوازی نیە لەگەڵ پیاو، ئەمە بابەتی یەکەم، بابەتێکی تر کە لەسەری دەوەستین -بە ویستی الله تعالى- هەروەها یەکسانن بەبێ جیاوازی کردن -لەبەردەم قانون- بەبێ جیاوازی کردن بەهۆی دین، واتە موسڵمان و ئێزیدی و نەسرانی و ڕافیضی و ئاشووری و کلدانی و شیوعی هەموویان وەك یەکن بەپێی ئەم قانونە؛ چونکە دەوڵەت دیموکراسییە و لەنێو بنەماکانی دیموکراسی یەکسانییە لە نێوان خەڵکی، ئەمەش بە هەمان شێوە لەسەری دەوەستین.

بابەتی سێیەم: ڕافیضە چونكە دەزانن ئەهلی سوننە دانیان پێدانانێن، بە هەمان شێوە كردوویانە بە یەكسان بوون لە مەزهەبیش، وشەی مەزهەبیان خستووەتە نێو دەستوری عێراقی، بۆیە وتیان: "عێراقییەكان یەكسانن لەبەردەم قانون بەبێ جیاوازی كردن بەهۆی ڕەگەز یان دین یان مەزهەب" وە لەسەر ئەم وشەی مەزهەبەش دەوەستین بۆ ئەوەی بزانین كە ئایا ئێمە یەكسانین یان نا.

جا لەسەر بابەتی یەكەم دەوەستین: "عێراقییەكان یەكسانن لە بەرامبەر قانون بەبێ جیاوازی كردن بەهۆی ڕەگەز"، ئایا ئافرەت یەكسانە لەگەڵ پیاو و پیاویش یەكسانە لەگەڵ ئافرەت لە دینی پاك و بێگەردمان؟ دێینە سەر وردەكاری، وە لێرەدا قسەكانم لەسەر بنەمای ئایەتەكان و فەرموودەكان دەبێت و مانای ئەوە نیە لە خوشكانمان یان دایكانمان یان كچەكانمان كەم بكەینەوە، بەڵكو ئەمە شەرعێكە بەهۆیەوە دینداری دەكەین بۆ الله عز وجل.

جا بابەتی یەكەم ئەوا پیاو یەكسان نیە لەگەڵ ئافرەت لە دینی پاكمان و ئافرەتیش وەك پیاو نیە لە دینی پاكمان، وە جیاوازییەكان لە نێوان نێرینە و مێینە دابەش دەبن بۆ دوو بەش: بەشێك لەم جیاوازییانە قەدەریی بنچینەییە، واتە الله عز وجل وای داناوە كە شتەكە لە لای پیاوان بەم شێوەیە بێت و لە لای ئافرەتانیش بەم شێوەیە، بۆیە بەشێك لە جیاوازییەكان بنچینەیی قەدەرییە، بەڵام بەشی دووەم لە جیاوازییەكان ئەمەیان شەرعییە، واتە الله عز وجل دەقی داناوە لەسەر هەندێك لە جیاوازییەكانی نێوان پیاو و ئافرەت لە بابەتە شەرعییەكان، سەبارەت بە جیاوازییە قەدەرییە بنچینەییەكان لە نێوان پیاو و ئافرەت -وەك ئاشكرایە باسەكە دەربارەی ڕەگەزی پیاوان لەگەڵ ڕەگەزی ئافرەتانە، نەك لەبارەی تاكەكانی پیاوان لەگەڵ تاكەكانی ئافرەتان، نەخێر، ڕەگەزی پیاوان جیاوازە لە ڕەگەزی ئافرەتان- وە جیاوازییە قەدەرییەكانیش یەكەمیان: لە ڕووی پێكهاتە و شێوەوە، پیاو جیاوازە بە دانانێكی بنچینەیی خوایی لە شێوە و پێكهاتەی ئافرەت، جا الله تعالى هێزی داناوە لە ڕەگەزی پیاوان و لاوازیی داناوە لە ڕەگەزی ئافرەتان لە ڕووی پێكهاتەی جەستەیی، بەڵگەی ئەمەش لە پەڕتوكی الله عز وجل ئەو ئافرەتەی مەڕوماڵاتی بەخێو دەكرد و پێغەمبەر موسا ماڵاتەكەی بۆ ئاودان ئینجا یەكێك لە كچەكان پێشنیاری كرد بۆ باوكی وتی ﴿يَـٰٓأَبَتِ ٱسْتَـْٔجِرْهُ ۖ إِنَّ خَيْرَ مَنِ ٱسْتَـْٔجَرْتَ ٱلْقَوِىُّ ٱلْأَمِينُ﴾[1] ، واتە: بابە بە كرێی بگرە، چونكە بەڕاستی چاكترین كەسێك كە تۆ بیگریت بە كرێ، ئەم پیاوە بەهێز و ئەمین و دەستپاكەیە. چونكە هێزی بینی لە پێغەمبەر موسا، ئەمەش مانای ئەوە نیە كە تەنها خودی پێغەمبەر موسا بەهێز بێت، بەڵكو هەر كەسێك بتوانێت بەردەكە لەسەر بیرەكە دابنێت ئەوا بەهێزە و هەر كەسێكیش بتوانێت بەردەكە بەرز بكاتەوە ئەوا بەهێزە، بەدڵنیاییەوە ئەم ئافرەتە نەیدەتوانی ئەمە بكات، ئەمە بەڵگەیەكە دەكرێت بە بەڵگە بهێنرێتەوە.

---

(١)القصص: ٢٦ .

سەبارەت بە بەڵگەی تر: فەرموودەی الله تعالى لەبارەی بەنی ئیسرائیل ﴿وَقَضَيْنَآ إِلَىٰ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ فِي ٱلْكِتَٰبِ لَتُفْسِدُنَّ فِي ٱلْأَرْضِ مَرَّتَيْنِ وَلَتَعْلُنَّ عُلُوًّا كَبِيرًا ۝٤ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ أُولَىٰهُمَا بَعَثْنَا عَلَيْكُمْ عِبَادًا لَّنَآ أُو۟لِي بَأْسٍ شَدِيدٍ﴾[1]ئەوانەی چوون بۆ جەنگکردن لەگەڵ جوولەکە تەنها پیاو بوون، ئافرەتیان تیادا نەبوو، وە الله عز وجل وەسفی کردن بەوەی خاوەنی هێز و توانای زۆر و هەڵمەتی توندوتیژن لە جەنگدا، وە ئەم وەسفەش لە پیاوان هەیە و لە ئافرەتان نیە، هەروەها پێغەمبەر سولەیمان کاتێك نامەکەی نارد بۆ (سبأ) و ئینجا وەڵام هاتەوە و دوای ئەمە دیارییان نارد ئەویش فەرمووی﴿فَلَنَأْتِيَنَّهُم بِجُنُودٍ لَّا قِبَلَ لَهُم بِهَا﴾[2] ، واتە: واتە: سوێند بە خوا دەبێت بە سەربازانێکەوە بچینە سەریان کە نەیان دیبێت و نەتوانن بەرگەی بگرن. بەدڵنیاییەوە ئەو سەربازانە هەمیشە لە چینی پیاوان دەبن و هەرگیز لە چینی ئافرەتان نابن بەدرێژایی مێژوو.

جا هێزەکە بە قەدەری بنچینەیی خواییە کە پیاو لە پێکهاتەکەیدا جیاوازە لە ئافرەت لە پێکهاتەکەیدا، ئەمە لە لایەنی هێزی جەستەیی، چۆن دەیسەلمێنیت -دوای ئەوەی سەلماندمان هێز لە پیاوانە- چۆن دەیسەلمێنیت لاوازی لە ئافرەتاندایە؟ الله تعالى دەفەرموێت﴿وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَٰلُهُۥ فِي عَامَيْنِ﴾[3] ، واتە: ئێمە فەرمانمان داوە بە ئادەمیزاد بە چاك ڕەفتاری لەگەڵ دایك و باوکیدا، بەتایبەتی لەگەڵ دایکیدا.. دایکی بە پێستی سك هەڵیگرتووە بەلاوازی لەسەر لاوازی، شیر بڕینەوەشی لە دوای دوو ساڵە. ئافرەت لە بنچینەدا لاواز و کەم توانایە، کاتێکیش سکپڕ دەبێت زیاتر لاواز و بێهێز دەبێت، کەوایە (وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ) لە بنچینە لاوازە و کاتێك سکپڕ دەبێت لاوازییەکەی زیاتر دەبێت لەسەر ئەو لاوازییەی کە لە بنەڕەتدا تیایدایە (وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ) بۆیە هەموو دایکێك لاوازی تیایە، وە کاتێك سکپڕ دەبێت زیاتر لاواز و بێهێز دەبێت لە پێشووی، بۆیە بێهێزی و لاوازی لە بنچینەدایە، ئەمەش جیاوازی یەکەمە کە قەدەریی و بنچینەییە.

جا جیاوازییەکی تر لە ڕووی ئەرك و فەرمانەوەیە، الله تعالى هەندێك ئەرکی بۆ ئافرەتان داناوە کە لە پیاواندا نیە، وە لەنێو ئەو ئەرکانەش بابەتی سکپڕییە، الله تعالى دەفەرموێت (وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ) بۆیە سکپڕی تەنها لە ئافرەتان دەبێت هەروەها فەرموودەی الله تعالى لە سوڕەتی -الأعراف- دەفەرموێت ﴿فَلَمَّا تَغَشَّىٰهَا حَمَلَتْ حَمْلًا خَفِيفًا فَمَرَّتْ بِهِۦ ۖ فَلَمَّآ أَثْقَلَت دَّعَوَا ٱللَّهَ رَبَّهُمَا لَئِنْ ءَاتَيْتَنَا صَٰلِحًا

---

(١) الإسراء: ٤ - ٥.

(٢) النمل: ٣٧.

(٣) لقمان: ١٤.

﴿لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ١٨٩﴾ ، واتە: جا کاتێك پیاوەکە چووە لای هاوسەرەکەی، ئەویش سکی پڕبوو بە کۆرپەلەیەکی سووك، ئافرەتەکەش تێپەڕی کرد بەو ماوەیەدا، ئینجا کاتێك کە باری بەرەو سەنگینی دەچێت ئەو ژن و مێردە لە الله دەپاڕێنەوە و دەڵێن: خوایە سوێند بە تۆ، ئەگەر منداڵێکی باش و بێ عەیبمان پێببەخشیت، ئەوە بەڕاستی لە سوپاسگوزارانی تۆ دەبین.

کەوایە ئافرەت سکپڕ دەبێت و ئەمەش لە پیاواندا نیە، وە ئەمە جیاوازییەکی بنچینەیی قەدەریی خواییە، ئەمە لە لایەنی سکپڕبوون، منداڵبوونیش بە هەمان شێوە لە ئافرەتان ڕوودەدات نەك لە پیاوان، الله تعالی دەفەرموێت﴿قَالَتْ رَبِّ إِنِّي وَضَعْتُهَآ أُنثَىٰ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا وَضَعَتْ وَلَيْسَ ٱلذَّكَرُ كَٱلْأُنثَىٰ﴾[1] ، واتە: وتی: پەروەردگارا خۆ من کچم بوو، بێگومان الله خۆی چاك دەزانێت کە چی بووە، کوڕیش وەکو کچ نیە. خێزانی عیمران کاتێك سکپڕبوو و نەزری کرد کە کۆرپەلەکە بکاتە خزمەتکارێك لە (بيت المقدس) ئەگەر نێر بێت، بەڵام کاتێك بووی منداڵەکە مێینە دەرچوو (قَالَتْ رَبِّ إِنِّي وَضَعْتُهَآ أُنثَىٰ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا وَضَعَتْ وَلَيْسَ ٱلذَّكَرُ كَٱلْأُنثَىٰ) جا بابەتی سکپڕبوون و منداڵبوون دانراوێکی بنچینەیی خواییە لە ڕەگەزی ئافرەتان.

دوای ئەوە قۆناغی شیرپێدان دێت بە هەمان شێوە ئەویش لە کاری ئافرەتانە و جیاکەرەوەیەکە لە نێوان ڕەگەزی پیاوان و ڕەگەزی ئافرەتان، الله تعالی دەفەرموێت﴿وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ﴾[2] ، واتە: دایکان دوو ساڵی تەواو با شیر بە منداڵەکانیان بدەن بۆ هەر کەس کە دەیەوێت شیری تەواو بدات. جا ئەمەش لە چوارچێوەی ئەرك و کارەکانی ئافرەتە و لە ئەرك و کارەکانی پیاو نیە، بۆیە ناکرێت بە ڕەهایی بڵێین پیاو یەکسانە لەگەڵ ئافرەت و ئافرەتیش یەکسانە لەگەڵ پیاو.

شتێکی تر بە هەمان شێوە لە جیاوازییە قەدەرییە بنچینەییەکانە ئەویش ئەوەیە ڕەگەزی پیاوان فەزڵی دراوە بەسەر ڕەگەزی ئافرەتان، الله تعالی دەفەرموێت﴿ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ﴾[3]، واتە: پیاوان سەرپەرشتیارن بەسەر هاوسەرەکانیانەوە، ئەمەش بەهۆی ڕێز و زیادە ئەرکێکەوە کە الله داویەتی بە هەندێك بەسەر هەندێکی تردا. جا ئەم سەرپەرشتیکردنە لە ئەنجامی فەزڵ دانەوە لە نێوان پیاوان و ئافرەتان هاتووە، بەڵام ئەم فەزڵ دانە لە لایەن کێیەوە؟ لە الله ـوەیە -عز وجل-، هەر بۆیەش نابینی کە پیاو شانازی بکات بەوەی پیاوە و نابینی ئافرەتیش لە دەروونیدا شتێك هەبێت بەهۆی ئەوەی ئافرەتە؛ چونکە ئەمە ویستی قەدەریی الله ـیە کە فڵان بە نێر دروست بکات و فڵانیش بە

(١) آل عمران: ٣٦.
(٢) البقرة: ٢٣٣.
(٣) النساء: ٣٤.

مێ دروست بکات، کەوایە (ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ ) ئەمە لە جیاوازییە قەدەرییە بنچینەییەکانە لە نێوان پیاوان و ئافرەتان.

جیاوازیێکی تر کە ئەویش قەدەرییە: ئافرەت تووشی هەندێك حاڵەت دەبێت کە لە پیاواندا ڕوونادات و بەهۆی ئەم حاڵەتانەوەش ئافرەتەکە واز لە نوێژ و ڕۆژووگرتن دەهێنێت، ئەمەش بە هەمان شێوە جیاوازیێکی قەدەریی خواییە، هەموو ئافرەتێك تووشی ئەو حاڵەتانە دەبێت کە باسم کرد و ئەمەش جیاکەرەوەیەکی قەدەریی بنچینەییە.

جیاوازیێکی تر هەیە کە ئاماژەی پێدەدەم: الله تعالی وای داناوە لە سروشتی ئافرەت کە ئارەزووی خۆجوانکردن و خۆڕازاندنەوە دەکات و هەروەها دەبینی لە کێشمەکێشم و ململانێیەکاندا لاوازە، الله تعالی دەفەرموێت ﴿أَوَمَن يُنَشَّؤُاْ فِي ٱلۡحِلۡيَةِ وَهُوَ فِي ٱلۡخِصَامِ غَيۡرُ مُبِينٖ ١٨﴾[1] ، واتە: ئایا کەسێك بە منداڵی خوا ڕەوا دەبینن، کە لەنێو خشڵ و زینەتدا پەروەردە کرابێت و لە کێشمەکێشمدا و ململانێدا دەسەڵاتی نادیار بێت. ڕەگەزی ئافرەت هەمیشە حەزی بە خۆجوانکردن و خۆڕازاندنەوەیە ئەمەش لە پیاواندا نابینرێت، وە ئەگەر بشبینرێت ئەوا جیاوازییەکە لە جۆری خۆجوانکردنەکەیە لە نێوان پیاو و ئافرەتدا، بەڵکو ئافرەت هەر لە منداڵیەوە دەبینی بەلای خۆڕازاندنەوە دەچێت و ئەوەش کە الله عز وجل باسی کردووە (أَوَمَن يُنَشَّؤُاْ فِي ٱلۡحِلۡيَةِ وَهُوَ فِي ٱلۡخِصَامِ غَيۡرُ مُبِينٖ ) ڕەگەزی ئافرەتان کاتێك بیەوێت بەرگری بکات و بەڵگە بچەسپێنێت، زۆربەی جار ناتوانێت هەربۆیە قەتادە -رحمه الله- هەروەك ئیمامی قورتوبی لێی دەگێڕێتەوە کە وتویەتی: " قسەم لەگەڵ هەر ئافرەتێك کردبێت حوججە و بەڵگەیەکی هەبووبێت ئەوا هەر بەسەر خۆیدا شکاوەتەوە"، ئافرەتێك قسە دەکات و بەڵگەیەکی لەلایە، لە کۆتاییدا دەیچەسپێنێت لەسەر خۆی چونکە ناتوانێت بەرگری لە خۆی بکات، ئەمە لە ڕەگەزی ئافرەتانە، بەڵام دەشێت لە ئافرەتاندا هەبێت بتوانێت بەڵگە بچەسپێنێت زیاتر لە فڵانە کەس لە پیاوان، بەڵام شێوە گشتییەکە لە ئافرەتاندا ئەمە بوو کە الله تعالی باسی کردووە، بۆیە کاتێك بۆمان ڕوونبووەوە هەندێك جیاوازی هەیە لە لایەنی پێکهاتە و هێزی جەستەیی، وە دوای ئەمە ئەو خاڵانەی باسم کرد لە حاڵەتەکانی سکپڕبوون و منداڵبوون و دانان و شێرپێدان، وە بەهۆی ئارەزووکردنی بە خۆجوانکردن و توانا نەبوونی لە کێشمەکێشمدا، هەموو ئەو سیفەتانە نابێت لە پێغەمبەران هەبێت، بۆیە هەڵبژاردنی قەدەریی بنچینەیی الله عز وجل ئاوایە کە پێغەمبەران دەبێت لە پیاوان بن و لە ئافرەتان نەبن﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ إِلَّا رِجَالٗا نُّوحِيٓ إِلَيۡهِمۡۖ فَسۡـَٔلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ إِن كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ٤٣﴾[2] ، واتە: وە لە پێش تۆیشدا ئەی پێغەمبەر (ﷺ) هەر لە

(١) الزخرف: ١٨ .

(٢) النحل: ٤٣.

پیاوانمان کردۆتە پێغەمبەر و سروشمان بۆ کردوون، جا ئەگەر ئێوە ئەو ڕاستییەتان نەزانیوە و نکوڵی دەکەن، دەسا لەوانەی زانا و بەئاگان لە بەڵگە و کتێبەکان بپرسن. ئەم جیاوازییانە دانی پێدادەنێین هەرچەندە قانون یان دەستور دانی پێدابنێت یان دانی پێدانەنێت، کارمان بەوانەوە نیە بەڵام بەدڵنیاییەوە ئەوان نایانەوێت دانبنێن بەم جیاوازییانە چونکە ئەمە هەندێك جیاوازی شەرعییە، ئەمەش بەشی یەکەمە لە چەسپاندنی (وَلَيْسَ ٱلذَّكَرُ كَٱلْأُنثَىٰ).

سەبارەت بە جیاوازییە شەرعییەکان لە نێوان پیاو و ئافرەت -ئەمە لە دینی پاك و بێگەردمان- جیاوازی یەکەم: الله عز وجل کاتێك سەرپەرشتیاری (القوامة) داوە بە پیاو لە خێزاندا ئەوا هەندێك شت دەکەوێتە سەر ئەم سەرپەرشتیارییە، ئەویش بەوەی خەرجی دان بۆ ئافرەتەکە و تاکەکانی خێزانەکەش لە چوارچێوەی کاری پیاوەکە دەبێت و ئەو بەرپرس دەبێت لە خەرجی دان، الله تعالى دەفەرموێت (ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ وَبِمَآ أَنفَقُوا۟ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ) کەوایە فەزڵ دانەکە لە دوو لایەنەوە هاتووە: سەرپەرشتیاری و خەرجیدان، بۆیە الله تعالى کردوویەتی بە تەشریع کە پیاو پێی سپێردراوە خەرجی ئافرەت بدات.

وە بەدڵنیاییەوە بانگەشەکەرانی ئازادکردنی ئافرەت لە لای ئەم ئایەتە وەستاون و زانیویانە کە سەرپەرشتیاری بۆ پیاوە و دەبێت قسە بۆ ئەو بێت لە خێزاندا، یەکێك لە هۆکارەکان: لایەنی ماددییە، جا ویستیان ئەرك و پیشە بخەنە سەر شانی ئافرەت تاوەکو کۆتایی بێنن بە دەسەڵاتی پیاو؛ چونکە ئافرەت ئەگەر داهاتێکی دارایی هەبوو ئەمە واتە سەرپەرشتیارییەکە بۆ پیاو نابێت لە خێزاندا؛ چونکە پیاو هەتاوەکو خەرجی بدات ئەوا سەرپەرشتیاری بۆ ئەوە، بەڵام کاتێك ئافرەت داهاتێکی دارایی هەبوو ئەمە واتە کۆتایی هێنا بە سەرپەرشتیاری پیاو لە بابەتی دارایی، وە لێرەوە ویستیان هانی ئافرەت بدەن لەسەر کارکردن و بینێرن بۆ پیشە و ئەرك بۆ ئەوەی مووچەیەکی مانگانە و سەرچاوەیەکی دارایی هەبێت، وە لە ڕاستیدا هیچیان بۆ ئافرەت زیاد نەکرد جگە لە چەندین قورسایی و سەختی لەسەر ئەوەی کە خۆی هەیەتی، جا هەر بە ئافرەتی مایەوە و نەگۆڕا، هەموو ئەوەی کردیان ئەوە بوو کە قورسایی پیشە و کاریان زیاد کرد لەسەر قورسایی ماڵ، بۆیە ماڵەکەی فەرامۆش کرد لە پێناو سەرچاوەیەکی دارایی، کە الله عز وجل کردبووی بە کاری پیاوەکە و لە ئەستۆی ئەودایە کە خەرجی ئەو بدات، بۆیە دەبینی لە بەیانییەوە خواحافیزی دەکات لە منداڵەکانی لە دایەنگە پاشان دەڕوات بەرەو کارکردن پاشان دەگەڕێتەوە بە ماندوویی، جا نەدەتوانێت هەڵسێت بە کاروباری ماڵەوە و نە بە پێویستییەکانی ژیانی هاوسەرگیری و نە بە پەروەردەکردنی منداڵەکان، هەموو ئەمانە فەرامۆش دەکات لە بەرامبەر ئەوەی مووچەیەك بەدەستبێنێت بۆ ئەوەی سەرپەرشتیاری بۆ پیاو نەبێت لە ماڵ، بەم شێوەیە گومانیان بردووە بەڵام خراپیان کرد و چاکیان نەکرد.

جا ئەم سەرپەرشتيارييە لە ڕووى شەرعييەوە خەرجى دانى لەسەر پەيوەست دەبێت، ئەم حاڵەتەش لە وڵاتانى ئەوڕوپا تيايدا ناژين، نازانم جارێك لە كامە پەڕتوك بوو خوێندمەوە كە پياوێك لە يەكێك لە وڵاتانى ئەوڕوپا بوو جا ئافرەتێكى بەساڵاچووى بينى كارى دەكرد، تەمەنەكەى گونجاو نەبوو بۆ كاركردن وەك پاككردنەوەى ماڵ و ئەم جۆرە شتانە، ئينجا پێى وت: ئايا هاوسەرت نيە، منداڵت نيە خەرجيت بۆ بدەن لە كاتێكدا تۆ لەم تەمەنە كار دەكەى؟ وتى: ئەگەر هەشبن ئەوا ئەوان ڕانەسپێردراون بەوەى خەرجيم بۆ بدەن، من خۆم خەرجى خۆم دەدەم، ئەويش پێى وت: ئێمە لە دينەكەمان كوڕ و باوك ياخود مێرد ئەوانە هەڵدەستن بە خەرجى دان، ئافرەت هيچ ناكات، ئەم ئافرەتەش وتى: ئێمە ئەمە نازانين لە وڵاتەكەمان، جا ئەمە جياوازيێكى شەرعييە لە نێوان نێرينە و مێينەدا (وَلَيْسَ ٱلذَّكَرُ كَٱلْأُنثَىٰ)

جياوازييێكى تر بەهۆى سەرپەرشتيارى: بەهۆى ئەوەى الله عز وجل بەڕێوەبەردنى كاروبارەكانى لەناو ماڵدا داوەتە دەست پياو، كەوايە چارەسەركردنى كێشەكانيش لە دەست پياوە نەك ئافرەت، وە الله تعالى كۆمەڵێك چارەسەرى داناوە بۆ چارەسەركردنى كێشەكان لە نێوان پياو و هاوسەرەكەى ئەگەر دەستى كرد بە ياخيبوون لێى و سەركەشى كرد و گوێڕايەڵى نەدەكرد، الله تعالى دەفەرموێت ﴿وَٱلَّٰتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَٱهْجُرُوهُنَّ فِي ٱلْمَضَاجِعِ وَٱضْرِبُوهُنَّ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلَا تَبْغُواْ عَلَيْهِنَّ سَبِيلًا إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيًّا كَبِيرًا﴾[1] ، واتە: ئەو ئافرەتانەش ئێوە دەترسن سەركەشى و سەرپێچى بكەن سەرەتا ئامۆژگاريان بكەن، (ئەگەر سوودى نەبوو) لەناو جێ خەودا پشتيان تێبكەن، (ئەگەر ئەوەش سوودى نەبوو) لێيان بدەن (بە مەرجێك لێدانەكە لە دەم و چاو نەبێت و شوێنەوار بەجێنەهێڵێت)، ئەگەر بەم هۆيانەوە لە لادان و ياخى بوون وازيان هێنا، ئەوە ئيتر ستەميان لێمەكەن و ڕێگەى تر مەگرنەبەر بێگومان الله بەرز و بڵند و گەورەيە.

ئەم سەرپەرشتيارييە لە ڕووى شەرعەوە لە خێزانى موسڵماندا الله عز وجل داويەتى بە پياو كاتێك كێشەيەك ڕوويدا لە نێوان پياو و هاوسەرەكەى، (نشزت) واتە: دەست بكات بە گوێڕايەڵى نەكردنى مێردەكەى، ئەو چارەسەرانەى الله عز وجل دايناوە ئەمانە چارەسەرى شەرعيين بەهۆيانەوە دينداری پێدەكەين بۆ الله عز وجل، بۆچى؟ چونكە ئەو زاتەى ئافرەتى دروستكردووە زانيويەتى چى لەگەڵ ئاكارەكەى دەگونجێت، بەديهێنەرى شتەكە شارەزاترە بەوەى دروستى كردووە، ئافرەتى دروستكردووە و دەزانێت ئاكار و سروشتى ئافرەت چۆنە، بۆيە كاتێك كێشەيەك هاتە ئاراوە لە نێوان پياو و هاوسەرەكەى ڕوو لە كێ دەكەن؟ الله عز وجل فەرمووى پياوەكە ئەم كێشەيە چارەسەر دەكات، ڕێگاى يەكەم:

(١) النساء: ٣٤.

پیاوەکە دەست بکات بە ئامۆژگاری کردن (**فَعِظُوهُنَّ**) وە ئەمەش بابەتانێکە لەوانەیە لە زۆرێك لە خێزانە موسڵمانەکان نەبینرێت، پیاوەکە دەیبینی لەوەوە دەست پێدەکات کە الله عز وجل لە کۆتایی داینێاوە، کۆتا شت تەڵاقە، کەچی ئەو لە سەرەتادا تەڵاق دەخوات یاخود دەست دەکات بە لێدان، ئەمەش دروست نیە لە ڕووی شەرعییەوە؛ چونکە الله عز وجل چارەسەرەکانی بە پلە داناوە بۆ ئەوەی ئەگەر چارەسەری یەکەم سوودی نەبوو بچێتە سەر چارەسەری دووەم، جا چارەسەری یەکەم ئەوەیە ئامۆژگاری بکات و الله عز وجل ـی بخاتەوە یاد و کە لەوانەیە فەرموودەی رسول الله (ﷺ) بیگرێتەوە (إذا دعا الرجل امرأته إلى فراشه فلم تأته فبات غضبان عليها لعنتها الملائكة حتى تصبح) [1]، واتە: ئەگەر پیاو بانگی ئافرەتەکەی بکات بۆ سەر جێیەکەی ئەویش نەیەت و ئینجا لێی تووڕە ببێت ئەوا فریشتەکان نەفرەتی لێدەکەن تاوەکو بەیانی. بەسە بۆی کە ئەم فەرموودەیە بزانێت و هەتا دوای ئەوە ملکەچ بێت بۆ حوکمی الله عز وجل نەك حوکمی پیاوەکە، بەڵام ئەمەش مانای ئەوە نیە کە دوای ئامۆژگاری کردنەکە ڕاستەوخۆ شوێنەوارەکان دەربکەوێت لەسەری، کارەکە پێویستی بە کاتە بۆیە پێویستە لەسەرت ئارام بگریت، ئینجا ئەگەر ئامۆژگاری چارەسەربوو بۆ کێشەکە، ئیتر کێشەکە کۆتایی پێدێت.

بەڵام ئەگەر بینیت ئامۆژگاری کردن هیچ سوودێکی نیە، ئەوا الله عز وجل فێرت دەکات کە پشتی تێبکەیت لەسەر جێ خەو، وە بابەتی پشتتێکردن لەسەر جێ هەروەك زانایان دەڵێن - الله شەرم ناکات لە حەق- : بریتییە لەوەی پیاوەکە پشتی وەرگێڕێت لە هاوسەرەکەی یاخود لە ژوورێکی تر بخەوێت، ئەمەش لە پشتتێکردنە، وە الله عز وجل دەزانێت ڕادەی کاریگەری ئەم ڕێکارە چەندە لە بەرامبەر ئافرەتەکەدا، هەر بۆیەش فەرمووی (**وَٱهْجُرُوهُنَّ فِى ٱلْمَضَاجِعِ** ) ئینجا ئەگەر سوودی نەبوو فەرمووی (**وَٱضْرِبُوهُنَّ** ) ئافرەتی موسڵمان بۆی نیە نکوڵی بکات لەم چارەسەرە خواییە؛ چونکە پیاو بە پیاوەتیەکەی یان بە سەرپەرشتیارییەکەی یان بە پێکهاتەکەی یان بە جەستەکەی ئەم چارەسەرەی نەوتوە، نەخێر، ئەوەی ئەم چارەسەرەی داناوە بەدیهێنەری ئافرەت و بەدیهێنەری پیاوە، چونکە لە ئافرەتان هەیە ڕاست نابێتەوە تەنها بە لێدان نەبێت، وە هەروەك دەزانن ڕێکخەرە شەرعییەکان لە نموونەی ئەم بابەتانەدا ئەوەیە کە نابێت لە سەر و ڕووخسار بدرێت یان لە سك بدرێت، بەڵکو دەکرێت لە پشت یان قاچەکانی بدرێت، (ابن عطاء) لە ئیبن عەباس ـی پرسی دەربارەی ئەم لێدانە، وتی: بە سیواك، بابەتەکە چییە؟ ئەوەیە هەست بکات بەوەی گەیشتووەتە قۆناغێك کە دەکرێت لێی بدرێت، جا ئەگەر لێدانەکەش

(١) متفق عليه .

سوودی نەبوو و کێشەکانیش هەر بەردەوام بوون، چارەسەری چوارەم ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُوا حَكَمًا مِّنْ أَهْلِهِ وَحَكَمًا مِّنْ أَهْلِهَا إِن يُرِيدَا إِصْلَاحًا يُوَفِّقِ اللَّهُ بَيْنَهُمَا﴾[1] ، واتە: خۆ ئەگەر ترسان لەوەی نێوان ژن و مێرد بشێوێت، دادوەرێك لە خزمی پیاوەکە و دادوەرێك لە خزمی ژنەکە بنێرن (بۆ ڕێکخستنیان) ئەگەر چاکسازی و ڕێکخستنیان بوێت، ئەوە الله پێکهاتن فەراهەم دەهێنێت لە نێوان ژن و مێردەکەدا، بێگومان الله هەمیشە و بەردەوام زانا و بەئاگایە. بۆیە ئەگەر ئەم چارەسەرەش سوودی نەبوو ئەوکاتە کارەکە دەگاتە تەڵاق، کەوابوو ئەمانە بابەتانێکی شەرعیین الله عز وجل داویەتی بەدەست پیاو و نەیداوەتە دەست ئافرەت. هەندێك شت هەیە ئینسان شەرم دەکات لە باسکردنی، بەڵام شوێنەکە پێویست بەمە دەکات، ئایا دەزانی قانونی ئەڵمانی دەڵێت پیاو ئەگەر بیەوێت کۆببێتەوە لەگەڵ هاوسەرەکەی و ئەویش ئارەزووی لێنەبێت ئەوا لە قانونی ئەڵمانی بە دەستدرێژی لە قەڵەم دەدرێت؟ وە ئەگەر ئافرەتەکە ئەمە بسەلمێنێت ئەوا پیاوەکە نۆ ساڵ زیندانی دەکرێت! جا ئەم کارە بپێوە و سەیری شەرعی الله تعالی بکە.

جا ئەمانە لە چوارچێوەی جیاوازییە شەرعییەکانە، هەروەها لە چوارچێوەی جیاوازییە شەرعییەکانیش لە شەرعی پاك و بێگەردمان بابەتی میراتە، وە ئەمەیە کە هەمیشە لە دەوری دەخولێنەوە، الله عز وجل دەفەرموێت ﴿يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلَادِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنثَيَيْنِ﴾[2] ، واتە: الله ڕێنموویتان دەکات و فەرمانتان پێ دەدا دەربارەی منداڵەکانتان لە بواری میراتی گرتندا (ئەویش ئەوەیە) کە بەشی نێرینەیەکیان ئەندازەی بەشی دوو مێینەیانە. ئەمە لە پەڕتوکی پەروەردگارمان، بەڵام لە قانونەکان و دەستورەکان و وڵاتانی دیموکراسی دەڵێت: "عێراقییەکان یەکسانن لەبەردەم قانون بەبێ جیاوازی کردن بەهۆی ڕەگەزەوە"، لە بابەتی میرات پیاو یەکسانە لەگەڵ ئافرەت و ئافرەتیش یەکسانە لەگەڵ پیاو ئەمە لە دەستور، بەڵام لە پەڕتوکی پەروەردگارمان، نەخێر، (يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلَادِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنثَيَيْنِ) ئەوەی کە هەمیشە لە ڕێگەیەوە دادەبەزنە سەر ئیسلام، ئایا وردەکاری و درێژەی میرات چییە لە نێوان پیاو و ئافرەت لە شەرعی پاك و بێگەردمان؟

الله تعالی هەندێك حوکمی داناوە بۆ پیاوان، وە هەندێك حوکمی داناوە بۆ ئافرەتان، بەپێی ئەم حوکمانە سەروەت و سامان دابەش دەکرێت بە میرات، لەسەر بنەمای ئەم حوکمانە سەروەت و سامان دابەش دەکرێت لە نێوان میراتگرەکان هەروەك هاتووە لە شەرعی پەروەردگارمان، سەرنج بدە (يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي

(١) النساء: ٣٥.

(٢) النساء: ١١.

أَوۡلَٰدِكُمۡۖ لِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۚ ) كەوایە هەندێك كات پیاو دوو هێندەی ئافرەت وەردەگرێت ئەمە جێگیرە، هەروەها لە ئایەتێكی تردا﴿وَلَكُمۡ نِصۡفُ مَا تَرَكَ أَزۡوَٰجُكُمۡ إِن لَّمۡ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٞۚ﴾[1] ، واتە: هەروەها نیوەی میراتی ژنەكانتان دەدرێت بە ئێوە ئەگەر منداڵیان نەبوو. ئەی ئەو (ئافرەتەكە) چەند وەردەگرێت؟ ﴿وَلَهُنَّ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكۡتُمۡ إِن لَّمۡ يَكُن لَّكُمۡ وَلَدٞۚ﴾[2] ، واتە: بۆ ژنان چواریەكی میراتی ئێوە بڕیاردراوە ئەگەر ئێوە منداڵتان لەدوا بەجێ نەمابێت. كەوایە هەندێك كات پیاو دوو پشك وەردەگرێت و ئافرەتیش یەك پشك، ئەمە لە حاڵەتێكی تایبەت، هەندێك كاتیش پیاو یەكسان دەبێت لەگەڵ ئافرەت لە میراتدا، ئەمەش لە شەرعی پەروەردگارمان، الله تعالی دەفەرموێت ﴿ وَإِن كَانَتۡ وَٰحِدَةٗ فَلَهَا ٱلنِّصۡفُۚ وَلِأَبَوَيۡهِ لِكُلِّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا ٱلسُّدُسُ﴾[3] ، واتە: خۆ ئەگەر مردووەكە تەنها كچێكی هەبوو ئەوە نیوەی داراییەكەی دەدرێتێ، شەشیەكیش دەدرێت بە هەریەك لە دایك و باوكی. جا لێرەدا باوك و دایك یەكسان بوون لە میرات، باوك شەشیەك وەردەگرێت و دایكیش بە هەمان شێوە شەشیەك وەردەگرێت، هەروەها ﴿وَإِن كَانَ رَجُلٞ يُورَثُ كَلَٰلَةً أَوِ ٱمۡرَأَةٞ وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوۡ أُخۡتٞ فَلِكُلِّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا ٱلسُّدُسُۚ فَإِن كَانُوٓاْ أَكۡثَرَ مِن ذَٰلِكَ فَهُمۡ شُرَكَآءُ فِي ٱلثُّلُثِۚ﴾[4] ، واتە: خۆ ئەگەر پیاوێك یان ئافرەتێك مرد منداڵ و باوك و باپیر و برا و خوشكی دایك و باوكی نەبوو، بەڵكو تەنها خوشكێك یان برایەكی دایكی هەبوو، ئەوە شەشیەك بەشی هەر یەكێك لەوان دەبێت، خۆ ئەگەر برا و خوشكی دایكی لە یەك زیاتر بوون ئەوە هەموویان هاوبەشن لە سێیەكی میراتەكەدا (بە یەكسانی ژن و پیاو).

كەوایە لێرەدا پیاو یەكسان بوو لەگەڵ ئافرەت چونكە بارەكە جیاوازە لە باری یەكەم كە باسمان كرد (لِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۚ ) جا لێرەدا یەكسانن.

هەندێك جار هەیە ئافرەت زیاتر وەردەگرێت لە پیاو، ﴿فَإِن لَّمۡ يَكُن لَّهُۥ وَلَدٞ وَوَرِثَهُۥٓ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ ٱلثُّلُثُۚ﴾[5] دایك لێرەدا زیاتر لە باوك وەردەگرێت ئەگەر لە ژیاندا بوو، بۆیە نابێت قسە بكرێت لەسەر ئیسلام بە بیانوی (لِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۚ ) و ئێمە دەمانەوێت یەكسانی بكەین لە نێوان پیاو و ئافرەت، پاشان لە بیر بكرێت كە شەرعی پەروەردگارمان لەسەر بنەمای بەخشینی سامانە لە هەموو جێگەیەك بەگوێرەی ئەوەی پێویستە، جا هەندێك جار (لِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۚ ) چونكە پیاو لەم جێگەیەدا خەرجی دان

(١) النساء: ١٢.
(٢) النساء: ١٢.
(٣) النساء: ١١ .
(٤) النساء: ١٢ .
(٥) النساء: ١١.

و مارەیی دانی لە ئەستۆیە، بۆیە ئەوەی مارەیی دان و خەرجی دانی لە ئەستۆیە ئەوا لە مافی ئەوە زیاتر وەربگرێت لەو کەسەی نە خەرجی لەسەرە و نە مارەیی و نە هیچ شتێك لەم ڕووەوە، بەڵام ئەگەر برا بن لە (الحواشي)، ئەوا ئەوانە یەکسان دەبن چونکە دەشێت منداڵی چەند باوکێك بن، بەڵام دەشێت برای مردووەکە بن یان خوشکی مردووەکە بن، بۆیە ئەگەر بابەتەکە لەبارەی براکان و خوشکەکان بوو ئەوا هەر یەکێکیان شەشیەك وەردەگرێت بە پیاوەکان و ئافرەتەکانەوە جا ئەگەر زیاتر بوون لەمە ئەوا هاوبەشن لە سێیەکی میراتەکەدا، پیاو ئەوەندە وەردەگرێت کە ئافرەت وەریدەگرێت، بەڵام لە باری سێیەم کاتێك ئافرەتەکە بەساڵاچوو و دوابڕاو بوو -منداڵی نەبوو- الله عز وجل بەشی ئەوی زیاتر داناوە؛ چونکە هیچ یارمەتیدەر و سەرپەرستیارێکی نیە بۆیە بەشەکەی لە میراتدا زیاتر دەبێت لە بەشی پیاو، ئەمە دابەشکردنێکی خوایی دادپەروەرە کە دامەزراوە لەسەر حوکمە شەرعییەکان، جا ئەم حوکمانە جیا نابنەوە لەو حوکمانەی پیاوان و ئافرەتان حوکمی پێدەکەن لە حاڵەتەکانی خەرجی دان و هاوسەرگیری، ئەمە بەستراوەتەوە بەوەیان بۆیە ناکرێت بابەتی میرات جیا بکرێتەوە لەو زاراوە و وشانەی الله تعالى باسی کردووە.

کەوایە بابەتی میرات هەمیشە ئافرەت کەمتر وەرناگرێت لە پیاو، بەڵکو هەندێك کاتە، جا لەم کاتانەدا بەشی ئافرەت ئەوەیە کەمتر وەربگرێت لە پیاو، ئەمە شەرعی ئێمەیە، بەڵام لە دەستور و قانون ئافرەت هەر چۆنێك بێت ئەوا یەکسان دەبێت لەگەڵ پیاو، ئەمە تەشریعێکە و ئەوەش تەشریعێکی ترە، ئەمە تەشریعێکی شەیتانییە و ئەوەی تریش تەشریعێکی خواییە.

بابەتی فرەژنیش الله عز وجل بۆ پیاوی داناوە لە شەرعدا ﴿فَٱنكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ مَثۡنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَۖ فَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا تَعۡدِلُواْ فَوَٰحِدَةً أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡۚ ذَٰلِكَ أَدۡنَىٰٓ أَلَّا تَعُولُواْ ٣﴾[1] ، واتە: دەسا ئەو ژنانە مارە بکەن کە پێتان دەشێن، دوان دوان، سیان سیان، چوار چوار، خۆ ئەگەر ترسان لەوەی کە نەتوانن دادپەروەر بن (لەنێوان هاوسەرەکانتاندا) ئەوە با یەك ئافرەت مارە بکەن یان ئەو کەنیزەکانەی کە هەتانن، ئەوەی کە باسکرا نزیکترە لەوەی ستەم نەکەن (ئەگەر پەیڕەوی بکەن).

ئەمەش بە هەمان شێوە لەو تەشریعانەیە کە الله عز وجل دایناوە لەبارەی پیاوانەوە نەك ئافرەتان، بۆیە ئافرەت ناکرێت هاوسەرگیری بکات لەگەڵ دوو پیاو لە یەك کاتدا، بەڵام دەکرێت بۆ پیاو کە هاوسەرگیری بکات لەگەڵ چوار ئافرەت لە یەك کاتدا، بەدیهێنەری ئینسان دەزانێت ئەم هاوسەنگیانە بەم ڕێگەیە ڕێکدەخرێت؛ چونکە ئیسلام کۆمەڵگەیەکی پاك وخاوێنی دەوێت دوور لە پیسی، ئەمەش یەکێکە لەو هۆکارانەی یارمەتیدەرە بۆ پاك و خاوێنی کۆمەڵگا، بۆیە پیاو ئەگەر بیەوێت هاوسەرگیری

(١) النساء: ٣.

بکات لەگەڵ زیاتر لە ئافرەتێك ئەوا بۆی هەیە، ئەوانەشی دەڵێن نابێت ئەوا دەبینی هاوسەرێکی هەیە و خۆشەویستێکی هەیە و عەشیقەیەکی هەیە، جا گەڕانەوە بۆ فیترەتی الله عز وجل و بۆ شەرعی الله بەڵام بە ڕێگایەکی ناشەرعی، بۆچی؟ چونکە تەشریعەکەیان لە دینی نەسرانیەت وەرگرت، وە هەروەك دەزانن دینی نەسرانیەت ڕێگە نادات بە هاوسەرگیری کردن لەگەڵ زیاتر لە ئافرەتێك، جا وازیان لە ئیسلام هێنا و ڕوویان کردە نەسرانیەت، وە وایان کرد پیاوی موسڵمان تەنها یەك ئافرەت بخوازێت و لێرەوەش فەساد دەستیپێکرد -پەنا بە الله-، وە وڵاتانی ئەوروپا هەروەك هەمیشە لێیان دەگێڕنەوە کە پیاو هاوسەرێکی هەیە و عەشیقەیەکی هەیە و خۆشەویستێکی هەیە، هەروەها لە خێزاندا "هاوڕێی خێزان" هەیە کە ئەمەیە کێشەکان و یەکێك لە کارەساتەکان پەنا بە الله، لەگەڵ ئافرەتەکە بە تەنیا دەمێنێتەوە و کەچی دەڵێت ئەمە هاوڕێی خێزانە! وە لەگەڵ کچەکە دەمێنێتەوە و دەڵێت ئەمە هاوڕێی خێزانە! جا ئەمەش لە جیاوازییە شەرعییەکان بوو لە دینەکەمان لە نێوان پیاو و ئافرەت.

هەندێك جیاوازی تر هەیە لە بابەتی پۆشاك، الله تعالی دەفەرموێت ﴿وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ آبَائِهِنَّ أَوْ آبَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَائِهِنَّ أَوْ أَبْنَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي أَخَوَاتِهِنَّ أَوْ نِسَائِهِنَّ﴾[1] واتە: با سەرپۆشەکانیان بدەن بەسەر سینە و ملیاندا و جوانی و زینەتی خۆیان دەرنەخەن تەنها بۆ هاوسەرەکانیان نەبێت، یان باوکی خۆیان، یان باوکی مێردەکانیان، یان کوڕی خۆیان، یان کوڕی مێردەکانیان، یان بۆ براکانی خۆیان، یان برازاکانیان، یان خوشکەزاکانیان، یان ئافرەتێك کە پەیوەندیان هەیە پێکەوە. ئەمانە هەمووی ڕێکخەری شەرعیین و جیاوازیشن لە نێوان پیاو و ئافرەت لە ڕووی تەشریع، کەوابوو دینەکەمان یەکسانی ناکات لە نێوان پیاو و ئافرەت لە هەموو ئەو بابەتانەی باسم کرد، بەڵام قانون و دەستور کە خەڵك دەچنە لای و دەڵێن: بەڵێ دەمانەوێت حوکم بکەین بەم دەستورە، دەڵێت: "عێراقییەکان یەکسانن لەبەردەم قانون بەبێ جیاوازی کردن بەهۆی ڕەگەز".

دێینە سەر بەشی دووەم لە بابەتەکەمان کە ئەویش: "عێراقییەکان یەکسانن لەبەردەم قانون بەبێ جیاوازی کردن بەهۆی دین"، ئایا موسڵمان یەکسانە لەگەڵ غەیری خۆی لە دینەکان؟ قانونی عێراقی دەڵێت بەڵێ، ئەی شەرعی پەروەردگارمان چی دەفەرموێت؟

لە دەستپێکدا، کافران لە پەڕتوکی پەروەردگارمان لە چینی ئاژەڵەکانن بەڵکو خوارتریش، واتە ئەگەر بتەوێت ئینسانەکان لەگەڵ جگە لە خۆیان لە دروستکراوەکان پۆلین بکەی، ئەوا کافران لە دینی ئێمەدا لە چینی ئاژەڵەکان دەژمێردرێن، وە بەڵگەی ئەمەش لە پەڕتوکی الله عز وجل ﴿وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ

(١) النور ٣١.

ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِۖ لَهُمۡ قُلُوبٞ لَّا يَفۡقَهُونَ بِهَا وَلَهُمۡ أَعۡيُنٞ لَّا يُبۡصِرُونَ بِهَا وَلَهُمۡ ءَاذَانٞ لَّا يَسۡمَعُونَ بِهَآۚ أُوْلَٰٓئِكَ كَٱلۡأَنۡعَٰمِ بَلۡ هُمۡ أَضَلُّۚ ﴾[١] ، واتە: سوێند بە خوا ئێمە زۆر لە جن و ئادەمیزادمان بۆ دۆزەخ دروست کردووە، ئەوانە دەزگای دڵیان هەیە و کەچی حەقی پێ تێناگەن، چاویشیان هەیە کەچی حەقی پێ نابینن، گوێیان هەیە کەچی حەقی پێ نابیستن، ئا ئەوانە وەکو ئاژەڵ وان بەڵکو ئەوانە وێڵ تریشن. وەك دەزانیت پیتی کاف لێرەدا پیتی لێکچواندنە، جا الله عز وجل کافرانی بە ئاژەڵان چواندووە، پاشان دوای ئەمە فەرمووی، نەخێر نەك تەنها هەر وەك ئاژەڵن بەڵکو لە خوار پلەی ئاژەڵانن، وە لە ئایەتێکی تردا﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَتَمَتَّعُونَ وَيَأۡكُلُونَ كَمَا تَأۡكُلُ ٱلۡأَنۡعَٰمُ وَٱلنَّارُ مَثۡوٗى لَّهُمۡ ﴾[٢] ، واتە: ئەوانەش کە بێباوەڕ بوون لەم دونیایەدا ڕادەبوێرن و دەخۆن وەك ئاژەڵ، لە ئایندەشدا دۆزەخ جێ و شوێنیانە. هیچ جیاوازییەك نیە کاتێك ڕادەبوێرێت و چێژ وەردەگرێت لە نیعمەتەکانی الله عز وجل و دەخوات لە بەروبووم و نیعمەتەکانی الله تعالی لە زەوی، جیاوازی نیە لەگەڵ هەر گیانلەبەرێکی تر کە هەر شتێك دەخوات لە زەوی، هەردووکیان وەك یەکن، بۆچی ئەو کەسانە لە چینی ئادەمیزاد دەرچوون لە کاتێکدا الله تعالی فەرموویەتی﴿ وَلَقَدۡ كَرَّمۡنَا بَنِيٓ ءَادَمَ وَحَمَلۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِ ﴾[٣] ، هەموو نەوەی ئادەم ڕێزلێگیراون، ئەی بۆچی ئەوانە لە چینی ڕێزلێگیراوەکان بوون پاشان دەرچوون لەڕێزلێگیراوەکان و کەوتنە ڕیزی ئاژەڵان بەڵکو لە خوار پلەی ئەوانیش؟ هۆکارەکە لەمەدا؛ چونکە ئەوان ئەو ئامانج و مەبەستەی بۆی دروستکرابوون نەیانهێنایە دی، الله تعالی دەفەرموێت: ﴿ وَمَا خَلَقۡتُ ٱلۡجِنَّ وَٱلۡإِنسَ إِلَّا لِيَعۡبُدُونِ ٥٦ ﴾[٤] ، واتە: بێگومان من جن و ئادەمیزادم دروست نەکردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێت کە من بپەرستن و فەرمانبەردام بن. ئەوانە الله عز وجل ـیان نەپەرست بەو دینەی ئەو دەیەوێت، بۆیە ئەوان وەك گیانلەبەرەکانن بەڵکو وێڵتریش لە گیانلەبەرەکان، چۆن ئەوانە وایان لێهات وێڵتر ببن لە گیانلەبەرەکان؟ الله تعالی دەربارەی فیرعەون دەفەرموێت﴿ قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَٰمُوسَىٰ ٤٩ قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِيٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَيۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ٥٠ ﴾[٥] ، واتە: فیرعەون وتی: باشە ئەی موسا پەروەردگاری ئێوە کێیە؟ ٤٩ موسا وتی: پەروەردگارمان ئەو زاتەیە کە هەموو شتێکی بەتایبەتی و ڕێکوپێکی دروست کردووە، پاشان ڕێنموویی کردووە، تا بەچاکی دەوری خۆی ببینێت. الله تعالی - پەروەردگارمان- ئەو پەرستراوەیە شێوەیەکی دیاریکراوی داوە بە هەموو دروستکراوێك، پاشان فێری

(١) الأعراف: ١٧٩.

(٢) محمد: ١٢.

(٣) الإسراء: ٧٠.

(٤) الذاريات: ٥٦.

(٥) طه: ٤٩ – ٥٠.

ئەوەی كردووە چی لێ داواكراوە، بۆیە دەبینی سەگ -پەرژین بێت لە ڕووتان- هەڵدەستێت بە ڕۆڵی پاسەوانی كردن، گورگ لە چینی سەگە ئەركەكەی ڕاوكردنە، هەردووكیان لە یەك چینن ئەمە پاسەوانی دەكات و دەپارێزێت و ئەوەی تریش ڕاو دەكات، بۆچی؟ پەروەردگارمان ئەو زاتەی هەموو شتێكی بە جوانی و بە ڕێكوپێكی دروستكردووە پاشان ڕێنموویی كردووە، فێری كردووە كە چی لێ داواكراوە و چی بكات لە ژیان، لێرەوە دەبینی الله تعالی دەفەرموێت﴿أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَسۡجُدُۤ لَهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ وَٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُ وَٱلنُّجُومُ وَٱلۡجِبَالُ وَٱلشَّجَرُ وَٱلدَّوَآبُّ﴾[1] ، واتە: ئایا نەتبینیوە و نەتزانیوە كە بەڕاستی هەرچی هەیە لە ئاسمانەكان و زەویدا سوجدە بۆ الله دەبەن، هەروەها خۆر و مانگ و ئەستێرە و چیاكان و درەخت و ماڵات. ئەمە هەمووی بە ڕەهایی بەڵام كاتێك دێتە سەر ئادەمیزاد دەفەرموێ ﴿وَكَثِيرٞ مِّنَ ٱلنَّاسِۖ وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيۡهِ ٱلۡعَذَابُۗ﴾[2] ، واتە: زۆرێكیش لە خەڵكی سوجدە دەبەن، زۆرێكیش خۆی شایستەی سزا و تۆڵە كردووە. كاتێك دەگاتە لای ئادەمیزاد، ئەو دروستكراوانە هەموویان سوجدە دەبەن بۆ الله و هیچ یەكێكیان یاخی نابێت لە سوجدە بردن یاخود سەرپێچی الله عز وجل بكات لە پەرستندا ﴿وَإِن مِّن شَيۡءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمۡدِهِۦ وَلَٰكِن لَّا تَفۡقَهُونَ تَسۡبِيحَهُمۡۚ﴾[3] ، واتە: هیچ شتێك نیە لەم بوونەوەرەدا كە تەسبیحات و ستایش و سوپاسی ئەو زاتە نەكات، بەڵام ئێوە لە تەسبیحات و ستایشی ئەو شتانە تێناگەن. بەڵام كاتێك باسەكە دەگاتە لای ئادەمیزاد دەفەرموێت زۆرێك لەوان سوجدە دەبەن و زۆرێكیش سزای الله ـی لەسەر شایستە و پێویست بووە، كەوایە ئەوانە ئەو ئەرك و فەرمانەیان جێبەجێ نەكردووە كە لە پێناویدا دروست بوونە بۆیە كەوتوونەتە خوار پلەی ئاژەڵ، ئاژەڵ هەڵدەستێت بە ئەركەكەی و گوێڕایەڵە و سوجدە دەبات و تەسبیحات دەكات بۆ الله تعالی، كەچی ئەوانە ڕادەبوێرن و خۆش دەگوزەرێنن بەڵام ئەوە جێبەجێ ناكەن كە داواكراوە لێیان لێرەوە ئەوان كەوتوونەتە خوار پلەی ئاژەڵ، ئایا ئەو كەسەی ئەمە حاڵیەتی لە پەڕتوكی پەروەردگار من و ئەو یەكسان دەبین و وەك یەكترین؟! تۆ و ئەو وەك یەكتر دەبن! .

شتێكی تر، هەروەك دەزانن الله عز وجل فەرمانی بە ئیماندارن كردووە بجەنگن لەگەڵ كافران و فەرمانی كردووە بە كوشتنیان﴿قَٰتِلُوهُمۡ يُعَذِّبۡهُمُ ٱللَّهُ بِأَيۡدِيكُمۡ وَيُخۡزِهِمۡ وَيَنصُرۡكُمۡ عَلَيۡهِمۡ وَيَشۡفِ صُدُورَ قَوۡمٖ مُّؤۡمِنِينَ ١٤﴾[4] ،﴿فَٱقۡتُلُواْ ٱلۡمُشۡرِكِينَ حَيۡثُ وَجَدتُّمُوهُمۡ وَخُذُوهُمۡ وَٱحۡصُرُوهُمۡ وَٱقۡعُدُواْ لَهُمۡ كُلَّ مَرۡصَدٖۚ فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ

(١) الحج: ١٨.

(٢) الحج: ١٨.

(٣) الإسراء: ٤٤.

(٤) التوبة: ١٤.

﴿ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّواْ سَبِيلَهُمْۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾[1] ، ئێمە فەرمان پێکراوین بە فەرمانی الله عز وجل بەوەی بجەنگین لەگەڵ ئەوانە، جا الله عز وجل بە چی ڕێزت لێدەنێت ئەگەر یەکێك لەوانەت کوشت کە لە خوار پلەی ئاژەڵن؟ فەرموودەیەك کە (أبي هريرة ﵁) لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە هەروەك لە لای ئیمامی موسلیم هاتووە فەرموویەتی (لا يجتمع كافر وقاتله في النار)، واتە: کافرێك و بکوژەکەی لە ئاگردا کۆناکرێنەوە. مادام دەیکوژی لە پێناو الله تعالی، تۆ لەگەڵ ئەودا کۆ ناکرێنەوە لە ئاگر، ئەو لە ئاگرە بەڵام بەدڵنیاییەوە بە ئیزنی الله تعالی تۆ لە بەهەشت دەبیت، کافرێك و بکوژەکەی لە ئاگردا کۆناکرێنەوە، کەوایە فەرمانی پێکردووین بجەنگین لەگەڵیان پاشان فەرمووی ئەگەر کوشتت لە پێناوی مندا تۆ لەگەڵ ئەو ناچیتە ئاگر؛ چونکە کافری کوژراو لەسەر دەستی ئیمانداری بکوژ، لە یەك شوێندا کۆنابنەوە، ئایا ئێمە و ئەوان یەکسانین؟! .

شتێکی تر، الله تعالی دەفەرموێت -ئەمەیان کاتێك بوو ئەگەر ئێمە بیانکوژین- بەڵام ئەگەر ئەوان یەکێك لە ئیمانداران بکوژن، الله تعالی دەفەرموێت﴿وَمَن يَقۡتُلۡ مُؤۡمِنٗا مُّتَعَمِّدٗا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَٰلِدٗا فِيهَا وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَلَعَنَهُۥ وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمٗا ٩٣﴾[2] ، واتە: هەر کەسێك بەدەستی ئەنقەست ئیماندارێك بکوژێت، ئەوە تۆڵەی ئەو کەسە دۆزەخە، نەمرە تیایدا، هەروەها الله لێی توڕە بووە و نەفرینی لێکردووە و سزایەکی گەورە و بێ سنووری بۆ ئامادە کردووە. ئایا من و ئەمە وەك یەکترین؟!

فەرموودەیەك هەیە (الترمذي) گێڕاویەتیەوە و بە صەحیحی داناوە دەڵێت: رسول الله ﷺ فەرمووی (لزوال الدنيا أهون عند الله من قتل رجل مسلم)، واتە: لەناوچوونی دونیا سادە و ئاسانترە لە لای الله لە کوشتنی موسڵمانێك. دونیا هەمووی لەناوبچێت ناکاتە هیچ لای الله تعالی، بەڵام کەسێکی موسڵمان نەکوژرێت، کەوابوو ئێمە لەگەڵ ئەوان یەکسان نین هەرچەندە دەستور وا بڵێت، وە هەرچەندە هاوەڵانی دیموکراسی وا بڵێن، وە هەرچەندە عەلمانییەکان وا بڵێن، وە هەرچەندە ئەفلاتونییەکان وا بڵێن، ئێمە شتێکین و ئەوانیش شتێك بۆیە یەکسان نین لە دین، وە یەکسان نابین لەگەڵ ئەوان هەتاوەکو ئەمە حاڵیان بێت، وە ئەمەش وەسفیانە لە پەڕتوکی الله عز وجل.

ئێستاش دێینە سەر بەڵگە ئاشکراکان کە دەیسەلمێنێت ئیماندار ناکرێت وەك کافر بێت، وە بە پێچەوانەی ئەوەی هاتووە لە دەستوری عێراقی و لە دیموکراسی و لە پەرلەمانەکان، الله تعالی دەفەرموێت ﴿أَفَمَن كَانَ مُؤۡمِنٗا كَمَن كَانَ فَاسِقٗاۚ لَّا يَسۡتَوُۥنَ ١٨﴾[3] ، واتە: ئایا ئەو کەسەی بڕوای هێناوە وەك ئەو کەسە وایە کە لە

---

(١) التوبة: ٥.

(٢) النساء: ٩٣.

(٣) السجدة: ١٨.

ئیمان دەرچووە، بێگومان ئەو دووانە چوونیەك نین. قانونی عێراقی چی دەڵێت؟ دەڵێت: وەك یەكترن، دەستوری عێراقی دەڵێت وەك یەكترن، پەروەردگارمان چی دەفەرموێت؟ دەفەرموێت وەك یەكتر نابن و یەكسان نین (أَفَمَن كَانَ مُؤْمِنًا كَمَن كَانَ فَاسِقًا لَّا يَسْتَوُونَ ) الله عز وجل دەفەرموێت نەخێر وەك یەكتر نین، وە دەستوری عێراقی دەڵێت وەك یەكترن، وە حیزبە پاڵدراوەكان بۆ لای ئیسلام حوكمی موسڵمانان دەكەن بەم قانونە بۆ ماوەی دە ساڵە، موسڵمانانیان وەك ئەوانە داناوە، وە الله تعالى دەفەرموێت وەك یەكتر نین (أَفَمَن كَانَ مُؤْمِنًا كَمَن كَانَ فَاسِقًا لَّا يَسْتَوُونَ ) یەكسان نین نە لە ژیان و نە لە مردن، وەك ئەوان نین لەگەڵیان نە لە ژیانمان و نە لە مردنمان و نە لە ڕۆژی دواییدا، الله تعالى لە سوڕەتی (الجاثية) دەفەرموێت ﴿أَمْ حَسِبَ الَّذِينَ اجْتَرَحُوا السَّيِّئَاتِ أَن نَّجْعَلَهُمْ كَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَوَاءً مَّحْيَاهُمْ وَمَمَاتُهُمْ ۚ سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴿٢١﴾﴾[1] ، واتە: ئایا ئەوانەی كە گوناهو تاوانەكانیان ئەنجام داوە، وایان زانیووە هەر وەك ئەوانە حیسابیان بۆ دەكەین كە ئیمانیان هێناوە و كاروكردەوە چاكەكانیان ئەنجام داوە؟! ژیانی دونیا و مردن و دوای مردنیان وەك یەك دەبێت؟! ئای كە بڕیاری خراپ دەدەن (ئەگەر پێیان وابێت هەردوولا یەكسان دەبن). بۆیە ناكرێت ئەوەی خراپەكان ئەنجام دەدەن وەك ئەو كەسە بێت كە باوەڕی هێناوە و كارە چاكەكان دەكات، ناكرێت نە لە ژیانیاندا نە لە مردنیاندا، ناكرێت وەك یەكتر بن، وە الله عز وجل دەفەرموێ بەو كەسەی حوكم دەدات بەوەی ئەوان یەكسانن و وەك یەكن دەفەرموێت (سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ ) ئەمە بڕیاردانێكی خراپە بە شایەدی الله عز وجل؛ چونكە سەرپێچی فەرمانی الله تعالى ـیان كردووە، ئیماندار لەگەڵ فاسیق وەك یەكتر نین، جا چۆن ئیماندار وەك كافر دەبێت و یەكسان دەبن؟ چۆن یەكسان دەبێت لەگەڵ ئیزیدی؟ چۆن یەكسان دەبێت لەگەڵ ڕافیضی؟ چۆن یەكسان دەبێت لەگەڵ سابیئی؟ چۆن؟! بۆیە یەكسان نین، هەروەها لە ڕۆژی دواییشدا یەكسان نین قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿أَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فَلَهُمْ جَنَّاتُ الْمَأْوَىٰ نُزُلًا بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١٩﴾ وَأَمَّا الَّذِينَ فَسَقُوا فَمَأْوَاهُمُ النَّارُ ۖ كُلَّمَا أَرَادُوا أَن يَخْرُجُوا مِنْهَا أُعِيدُوا فِيهَا وَقِيلَ لَهُمْ ذُوقُوا عَذَابَ النَّارِ الَّذِي كُنتُم بِهِ تُكَذِّبُونَ ﴿٢٠﴾ وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنَ الْعَذَابِ الْأَدْنَىٰ دُونَ الْعَذَابِ الْأَكْبَرِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٢١﴾﴾[2]، واتە: بەڵكو ئەوانەی كە باوەڕیان هێناوە و كردەوە چاكەكانیان ئەنجامداوە، شوێنیان باخچەكانی بەهەشتە، هەر لەوێ دادەبەزن، لە پاداشتی كارو كردەوەیەك كە دەیانكرد * ئەوانەش كە تاوانبار و یاخی بوون، شوێنیان ناو ئاگری دۆزەخە، هەر كاتێك ویستیان لێی دەرچن، دەگێڕدرێنەوە بۆ ناوی، پێیان دەوترێت: بچێژن سزای ئەو ئاگرەی كە بڕواتان پێی نەبوو *

(١) الجاثية: ٢١.

(٢) السجدة: ١٩ - ٢٠ – ٢١.

سوێند بە خوا ئێمە تاڵاو لە دونیادا دەکەین بە گەروویاندا، بێجگە لە سزای ڕیشەکەنکردنیان، بۆ ئەوەی هۆش و بیربکەنەوە و بگەڕێنەوە بۆ لای ئیمان. ئەوانە ئەوانن و ئەمانەش ئیمانداران، نە یەکسانن لە ژیاندا و نە یەکسانن لە مردندا و نە یەکسانن لە ڕۆژی دواییدا، هەرچەندە دەستوری عێراقی بڵێت ئەوان یەکسانن لەبەردەم قانون جیاواز نابن بەهۆی دین، دەڵێین: نەخێر، جیاوازیین، ئەمە پەڕتوکی پەروەردگارمانە و ئەمە دینی پێغەمبەرمانە و ئەمە ئایەتەکانی پەروەردگارمانە لە قورئانەکەماندا، جا چۆن دەکرێت وازبێنم لە ئایەتە خواییەکان پاشان برۆم بۆ لای دەستورێك کە دەڵێت هەمووان یەکسانن و جیاوازی نیە بەهۆی دین؟! ئەمە ئەو دەستورەیە حیزبی عێراقی بانگەشەی بۆ دەکرد، بەوەی موسڵمانان برۆن و دەنگی بۆ بدەن بە بەڵێ، وە ئەمە ئەو دەستورەیە کە حوکمی پێدەکەن ماوەی دە ساڵە بە مێزەرەکانیان و جوببەکانیان و ریشە کورتکراوەکانیان.

ئەمە قانونێکە حوکمی موسڵمانی پێدەکرێت! وە لە ئایەتێکی تردا الله عز وجل دەفەرموێت ﴿أَمْ نَجْعَلُ الَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَٱلْمُفْسِدِينَ فِى ٱلْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ ٱلْمُتَّقِينَ كَٱلْفُجَّارِ ﴿٢٨﴾﴾[١]، واتە: ئایا دەکرێت ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و کارە چاکەکانیان کردووە، وەکو بەدکاران و ئەوانەی تۆوی خراپەیان چاندووە لە زەویدا دابنێین و وەك یەك حیسابیان بۆ بکەین، یاخود ئایا ئەوانەی پارێزکار و لە خواترسن وەك خراپەکاران سەیریان بکەین؟! . ئیبن تەیمیە -رحمە اللە- دەڵێت: "هەر کەسێك کار بکات بە جگە لە پەڕتوکی الله و سوننەتی پێغەمبەرەکەی ئەوا بەڕاستی فەساد و خراپەکاری بڵاوکردووەتەوە لە زەوی"، ئەوانە کە فەسادی و خراپەکاری بڵاودەکەنەوە لە زەویدا لەگەڵ ئەوان یەکسانین و جیاوازی نیە لە نێوان ئێمە و ئەواندا؟! ئەمەی الله عز وجل ڕێزداری کردووە بە قورئان، وە ئەوەی شوێنکەوتووانی دەستوری زەلیلیان کردووە و ملکەچ دەبێت بۆ دەستور، وە خۆمان ڕێزدار نەکەین بە پەڕتوکی الله عز وجل، ئایەتێکی تر هەیە الله تعالی دەفەرموێت -سەرنجی ئەم ئایەتە پیرۆزە بدە- ﴿ أَفَنَجْعَلُ ٱلْمُسْلِمِينَ كَٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٣٥﴾ مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿٣٦﴾ أَمْ لَكُمْ كِتَٰبٌ فِيهِ تَدْرُسُونَ ﴿٣٧﴾﴾[٢] ، واتە: ئایا موسڵمانان وەك تاوانباران لێدەکەین و پاداشتیان وەك یەکتر دەدەینەوە؟! * ئەوە چیتانە؟ چۆن حوکم و بڕیاری نارەوای وا دەردەکەن! * ئایا کتێبێکی ئاسمانیتان بۆ هاتووە، تیایدا بخوێنن؟! . ئەم پرسیارە لە لایەن الله عز وجل ئاراستەی هەر یەکێك دەکات کە پەسەندی ئەوە دەکات حوکم بکرێت بەم قانونانە یاخود حوکم بکات بەم قانونە.

(ابن کثیر -رحمە اللە-) لە بابەتی پەڕتوکەکە (الکتاب) دەڵێت: "ئایا پەڕتوکێکتان لەبەردەستە کە لە

---

(١) ص: ٢٨.

(٢) القلم: ٣٥ –- ٣٦- ٣٧.

ئاسمانەوە هاتووە دەیخوێنن و لەبەری دەکەن و تاوتوێی دەکەن کە ئەوانەی لە دوایی هاتوون وەریانگرتووە لە پێشین، حوکمێکی جەختکراو و دڵنیا زامن دەکات؟" (أَمۡ لَكُمۡ كِتَٰبٞ فِيهِ تَدۡرُسُونَ) ئایا پەڕتوکێکتان لەبەردەستە کە الله عز وجل لە ئاسمانەوە دایبەزاندووە و ئەم پەڕتوکەش ئێوە تیایدا دەخوێنن و لەبەری دەکەن و تاوتوێی دەکەن بەجۆرێك ئەوانەی لە دوایی هاتوون بە میراتیانگرتووە لە پێشین؟ ئایا لەم پەڕتوکەدا هاتووە کە موسڵمانان وەك تاوانباران وان؟ ئایا دەزانی وەڵامەکە لە کوێیە؟ ئەوەی ڕۆیشتووە بۆ لای دەستور و وتویەتی: بەڵێ، دەڵێت بەڵێ ئەی پەروەردگار پەڕتوکێکمان هەیە خوێندوومانەوە کە پێمان دەڵێت -ماددەی چوارده- : "عێراقییەکان یەکسانن لەبەردەم قانون بەبێ جیاوازی کردن بەهۆی دین"، من ئەم پەڕتوکەم دۆزیوەتەوە و ئەم پەڕتوکەم خوێندووە و پەسەندی ئەوەم کردووە حوکم بکرێت بەم پەڕتوکە و هەروەها حوکمم بکرێت بەم پەڕتوکە، والله ئەوەی پەسەندی دەستور بکات ئەوا وەڵامی الله تعالی دەداتەوە (أَمۡ لَكُمۡ كِتَٰبٞ فِيهِ تَدۡرُسُونَ) بەڵێ پەڕتوکەکەیان دۆزیوەتەوە لە دەستور، وە ئەوەیان وتوە کە دەستور دەیڵێت، وە سەرپێچی حوکمی پەروەردگاریان کردووە کە ئەوان یەکسان نین و ناکرێت یەکسانیش ببن، ئەمە سەبارەت بە دین.

سەبارەت بە مەزهەبیش ئەوا دەستوری عێراقی دەقی نووسیوەتەوە لەسەر ئەوەی "عێراقییەکان یەکسانن لەبەردەم قانون بەبێ جیاوازی کردن بەهۆی مەزهەب" وە وشەی مەزهەبیان خستوەتە ناویەوە بەهۆی ڕافیضە بە دیاریکراوی، وە ناکرێت مەزهەبی ئەهلی سوننە و جەماعە یەکسان بێت لەگەڵ مەزهەبی ئەوانە چونکە ئەوان دەرچوونە لە ئیسلام، بەهۆی مەزهەبەکەیان دەرچوونە لە ئیسلام؛ چونکە دین لای ئێمە شتێکە و لای ئەوانیش شتێکی ترە، وە شیرك و ئیمان و کۆڵەکەکانی ئیسلام، بپرسە لە هەر منداڵێکی موسڵمان پێت دەڵێت: شایەدی دان بە لا إله إلا الله وأن محمداً رسول الله و نوێژکردن و زەکات دان و ڕۆژووی ڕەمەزان و حەج، ئەمە کۆڵەکەکانی ئیسلامە لە لای ئێمە، بەڵام لە لای ڕافیضە هەروەك لە "الكافي" گێڕەرەوەکانیان دەڵێن -پرسیارکرا لەبارەی کۆڵەکەکانی ئیسلام لە یەکێك لە پێشەواکانیان- وتی "ڕۆژوو و نوێژ و زەکات و ویلایەت و باشترینیشیان ویلایەتە" هەر بۆیە لە هەندێك گێڕانەوەدا هاتووە لە "الكافي" : "هەر کەسێك شیرك بڕیار بدات لەگەڵ پێشەوایەك کە پێشەوایەتییەکەی لە لایەن اللهـ وە بێت لەگەڵ ئەوەی پێشەوایەتییەکەی لە اللهـ وە نەبێت ئەوا شیرکی بڕیار داوە"

ئایا جیاوازی نێوان ئێمە و ئەوانت بینی لە بابەتی شیرك؟ پێشەوایەك کە پێشەوایەتییەکەی لە اللهـ وە بێت، ئەوانە کێن؟ یازدەن؛ چونکە دوازدەمین بوونی نیە، جا ئەگەر کەسێك بێت و بڵێت پێشەوایەتی فلان -کە لە اللهـ وە نیە- ئەویش پێشەوایە، ئەوا شیرکی بۆ الله بڕیارداوە، ئایا ئێمە و ئەوانە

مەزهەبەكەمان یەكسان و وەك یەكە؟ ئایا ئەوەی دین لە قورئان و لە فەرموودە صەحیحەكان وەردەگرێت وەك ئەوە وایە لە "الكافي" و لە "الاستبصار" و لە "التهذيب" و لە "فقيه من لا يحضره الفقيه" وەردەگرێت؟ بەدڵنیاییەوە مەزهەبەكەمان یەكسان نیە، ئایا ئەو كەسەی گریان و ناڵە و لەخۆدان و شمشێر لەخۆدانی كردووە بە دین وەك ئەو كەسە وایە كە پێغەمبەرەكەی (ﷺ)دەفەرموێت (ليس منا من لطم الخدود وشق الجيوب ودعا بدعوى الجاهلية) ئەم فەرموودەیە بوخاری -رحمه الله- گێڕاویەتیەوە، ئایا ئەم مەزهەبە وەك ئەو مەزهەبەی ترە، ئایا ئەوەی تەكفیری هەموو صەحابەكان دەكات جگە لە سێیانیان نەبێت، وەك ئەو كەسە وایە فەرموودەی الله عز وجل دەخوێنێتەوە ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ مِنَ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحۡسَٰنٖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ﴾[1] ، واتە: لە دەستەی یەكەمی كۆچەران و پشتیوانان و ئەوانەی كە بە ڕێكوپێكی شوێنیان كەوتوون، الله لێیان ڕازی بووە و ئەوانیش لەو ڕازی بوون. كەوابوو یەكسانی نیە لە دینەكەمان لەگەڵ كافراندا و یەكسانی نیە لە مەزبەهەكەمان لەگەڵ ڕافیضەدا، ئەمە دەستورە و ئەمە یەكسانیەكەیە و ئەمەش بنەمایەكە لە بنەماكانی دیموكراسی كە ئیخوانی میصر بانگەشەی بۆ دەكات، وە حیزبی عێراقی بانگەشەی بۆ دەكات، وە هەموو كلكەكانی ئیخوانی میصر بانگەشەی بۆ دەكەن لە هەر وڵاتێك بێت لە وڵاتەكان، ئەمە حاڵیانە لە تونس و ئەمە حاڵیانە لە لیبیا و ئەمە حاڵیانە لە مەغریب، وە هەروەك دەزانن سەرۆكی دەوڵەت كە تیاچوو لەم حیزبە بوو، هەمیشە حیزبی (العدالة والتنمية) كە هیچ شتێكیان تیا نیە لە دادپەروەری و هیچ شتێكیان تیا نیە لە گەشەكردن، بەڵام ئارەزووی ئەم ناوەیان كردووە بۆ ئەوەی ببێتە دروشمێكیان لە هەر كوێیەك بن، أقول قولي هذا وأستغفر الله لي ولكم وجزاكم الله خير الجزاء وبارك فيكم.

**وەرگێڕانی و ئامادەكردنی**
**پێگەی ڕاستەڕێ**




(١) التوبة: ١٠٠.